هۆزەکەی و هەوڵی دا بۆ بڵندکردنەوەی ئایینی خۆی، بەڕەنگێک کە دۆست و دوژمنی خۆی دانیان پیانا (هەندێکیش لە پیاوە گەورەکان لەناو ئیسلاما لەقەبی بەرز و نایابیان پێ بەخشراوە، لەبری ئەو ئیشانەی کە کردوویانە بۆ پێشڕەوی سوپای دوژمنەکانیان، تاکو ئەو حکوومەتە بێگانەیەیان لە وڵاتەکەیانا جێگیر کردووە، ئێستاش زۆری موسوڵمانان هەوڵ ئەدەن و کۆشش ئەکەن بۆ ئەوەی شتێک بدۆزنەوە و دەریان پەڕێنن و لەو حاڵە ڕزگار بن).

جا ئەو جێ نیشانە لە کوێ کە بەسنگی عثمان پاشای غازییەوە بوو لەگەڵ ئەو جێ نیشانەی کە بەسنگی ئەو تەفرە دراوانەوەیە، وا ئەزانم بەتەماشاکردنێکی ئەم دوو جێیە لێت ئاشکرا ئەبێ کە نیشانی شەرەفدار ئەبێ بەو فرمانە بەرزەوە کە بەڵگەیە بۆ ئەو و، بێ نرخیش ئەبێ بەبێ نرخی ئەو فرمانە، چ شتێک ئەو گومڕایانەی لەخۆ بایی کردووە؟ ئایا نازانن ئەو بەرگانەی خەت خەت و خاڵخاڵ کراون بەخوێن و ڕەنگاوڕەنگ کراون بەجوانمەردی، ئەوەیە ناوی چاکی پاراستووە بۆ خاوەنەکەی و نابڕێتەوە و، شوێنێکی گەورەی دروست کردووە کە لەناو ناچێ؟ ئەوانەی لە ڕێی هەوڵ و کۆششێ کە بۆ بڵندی هۆزەکەیان داوە لە خوێنی خۆیان تلاونەتەوە، ئەوانەن کە باسیان کرا بەترس و سەماوە گوێیان لێ ئەگیرێ و، لە هەموو دڵێکا پایەبڵندییان جێگیر بووە، ئایا نەیان بیستووە ئەوانە مردوون لە کون و قوژبنی زیندان و ژیانیان کۆتایی هاتووە لە تاریکی بەندیخانەدا لە پێناوی حەقێکی داگیرکراو، یا بۆ پاراستنی گەورەییەک کە بووبێت ئەوانەن ناویان بڵند بۆتەوە و گەیشتوونەتە ئاسمان ناویان بەسەر گشت ناوێکا بەرز بۆتەوە.

وا ئەزانم ئەوانەی کە لە ژووری کۆشکی بڵندیانا بوون و تەماشای باخ و بێستانەکانیان ئەکرد و ئەیانڕوانیە خەڵکی لەسەر بانی کۆشکە بەرزەکانیانەوە، ژیانی خۆیان ڕائەبوارد بەخۆشی دەست کەوتنیانەوە باسیان کۆتایی هات و، لە ژیانیانا هیچیان دەست نەکەوت تەنیا ئەوە نەبێ کە لە چواردیواری ماڵەکەیانا بوویانە. هیچ جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە لەگەڵ ئەوانا ئەوانەش کە جلەوی ناز و نیعمەتیان ڕائەکێشا و جلی ئاوریشم و دیبایان پەیا ئەکرد هەموو ڕۆیشتن بەخۆیان و جلیانەوە، پاشەوپاش چوونەوە بۆ ئەو جێیەی کە لێی هاتبوون. نازانرێت کەی هاتوونە سەر ئەم زەمینە و کەی کۆچیان لێ کردووە.

ئایا بیستراوە کەسێک ناو ببرێت لەناو خەڵقا و بڵێن ئەمە نیشانێکی وای وەرگرتووە



و گەیشتۆتە پلەیەکی بەرز؟ نا: بەڵام ئەڵێن تێگەییوو ئیشی کرد، بەخشی و لەناو برد، بڵندی کردەوە وا داینا، تێ کۆشا و بەرهەڵستی کرد، لەناوبرد و هێشتیەوە لەگەڵ ئەو ئیشانەی کە هاوتایی ئەمانە بکات و شوێنی بمێنێ، ئەگەر باسی ئەسکەندەری گەورە بکرێت ئاخۆ بەدڵا دێت کە کۆشکی بووە یا نا؟ چ شتێک هەیە بگەڕێت بۆ کردەوەی ناپلیۆنی یەکەم لە شوێنی ئەو کۆشکەی کە تیا دائەنیشت یا لەو جلە شڕ و شیتاڵانەدا کە لەبەری ئەکرد، ئایا گەورەکانی دنیا بەخانووکردن و خۆ ڕازاندنەوە و ناز و نیعمەت گەیشتوونەتە پایەی بڵندی شەرەف یاخو بەگەورەیی و وڵات داگیرکردن و سەرکەوتن و زەبر و زەنگ چنگیان کەوتووە؟ هەندێک بەخەو خۆش تەفرەی خواردووە و بایی بوون بەخەیاڵات و، دەست درێژییان کردووە لە ئیشی نیشتمانەکەیانا، ئەو شەرەف و گەورەییە بڵندەی کە بوویەتی فرۆشتوویانە بەو ناو و ناتۆرانەی کە بۆ هیچ دانەنراون و وا تێ گەیشتوون ئەگەرچی دڵیان باوەڕی پێ نەکردووە کە گەیشتوونەتە شەرەف و گەورەیی لە پاش ئەمە کە زانیویانە ئەو ڕوتبە و نیشانانە لە سنووری خۆی تێپەڕیوە و چنگ ناکەس کەوتووە. ئەگەر ئەوانە بێن و گوێ بگرن لەوەی کە بەدڵیانا دێت و لەو سەرزەنشتانەی دڵیان پێیان ئەکات و چاو بگێڕن و بەچواردەوری خۆیانا و تەماشای ئەوانە بکەن کە دەوری داون، ئەوسا ئەزانن لە پێشترین جێ سووکترین شوێنی بەدناویان و، خۆیان هەست ئەکەن کە لە مەعنای شەرەف بەهەڵە چوون و، تێ ئەگەن لە ڕێی ڕاست لایان داوە و دوورکەوتوونەتەوە ئەگەر پێ بزانن وڵاتەکەیان تووشی چ چورتمێکی گەورە بووە و، چ بەندەگی و شورەییەک ئاڵاوەتە نەتەوەکانیانەوە، بەرگە ڕەنگاوڕەنگ و مەدالیاکانیان توڕئەدا و بەرگی ڕەشیان ئەپۆشی و بەکۆمەک لەسەرخۆ ئەگەڕان بۆ دۆزینەوەی شەرەفی ڕاستەقینە.

شەرەف ڕاستیەکە ئاشکرا و دیارە کە ئایین نیشانی داوە و بیری زانایانی زەمین سنووری بۆ داناوە، ڕەوا نییە هیچ کەس لە ئادەمیزاد دوو دڵ بێ لە تێگەیشتن (مەگەر ئەوە نەبێ کە یەزدان دڵی ڕەش کردبێ و پەردەی تاریکی بەسەر چاویا کێشابێ)

شەرەف جوانی پیاوە، هەموو لێی ورد ئەبێتەوە، بیر و خواهشی دڵان ڕووی تێ ئەکا، جوانییەکە وێنەی لەبەر چاو و دڵان خۆشەویستە، ڕووناکی ئەو جوانییەش ئیشێکە کە خاوەنەکەی بیکا و شوێنێکی جوانی بێ لەناو هۆزەکەیا، یا لەناو نەتەوەی هۆزەکەیا، یا تێکڕا لەناو گشت ئادەمیزادا وەکو ڕزگارکردن لە جورتم، یا دەرخستن و لابردنی نەزانی، یا وریا کردنەوە بۆ داواکردنی حەقێکی داگیرکرابێ، یا وریاکردنەوە لە هەل ئەنگوتن، یا

بێدارکردنەوە لە بێ هۆشی، یا ڕێ نیشاندان بۆ چاکەیەکی گشتی، یا پاراستن لە خراپەیەک دڵتەنگی لە دوا بێ، یا لەناوبردنی کردەوەی ناشرین یا بیر ڕووناک کردنەوە، یا هێنانە بەرهەمی یەک قسەیی و تازەکردنەوەی دۆستایەتی، یا سەندنەوەی هێزێک و ڕزگارکردنی لە بێ دەسەڵاتی، یا هاندان بۆ ئازاییەک .

کەوابوو کەسێک ئەگەر ئیشێکی کرد و شوێنێکی بوو لەوانەی کە وتمان ئەوە (شەریف)ە با لەناو زنج و ژێر گەڵا دارا دانیشتبێ و جلە کۆن و خەرقە شڕی لەبەرابێ و سەوزایی دەشت و خواردەمەنی بێت و شەو لەسەر گڵی هەژاری ڕۆژ بکاتەوە و بەرد بکا بەسەرین و سەر بەهەمو دۆڵێکا بکا و، هاتوچۆ بکا لە بەرزایی و نشێویدا، ئەمە خشڵێکی هەیە لە کردەی خۆی، جوانییەکی هەیە لە پێگەیشتن، ڕەونەقێکی هەیە لە کەمالی، ڕوناکییەکی هەیە لە تێکۆشینی، ئەوانەی هۆشیان لێ گوم بووبێ و دڵیان پەرێشان بێ ڕووی تێ ئەکەن، خاوەنی بیری ورد ئەیانناسن و ڕوویان لێ وەرناگێڕن، کۆمەڵی دڵانی پاک و ئاوارە دەورەیان لێ ئەدەن و لێیان جوێ نابنەوە، لەو گیانەی کۆشکی بڵند و ژووری ڕەنگاوڕەنگ دیمەنی جوان جوان و جوانی پڕ لە ڕووناکی و پڕشنگی درەخشانی هەیە، وشەی پیرۆزی ڕوو لەو ئەکا ئیشی جوانیشی بڵندی ئەکاتەوە بۆ بەرزترین بەرزی، ژیانێکی پیرۆزی هەیە لە وڵاتا و شکوهێکی درەخشانی هەیە لە چاوی گەردوونا (ئەوانەی کە تێ ئەکۆشن با بۆشتی وا تێ بکۆشن).

بەڵێ زۆر جار قسەی ناشرین و سەرزەنشت ڕووی تێ ئەکا لەلایەن ئەوانەی کە دڵ و دەروونیان پیسە، پلار و توانجی تێ ئەگرن و لۆمەیی ئەکەن، خونچەی کردار و گۆپکەی درەختی باخەکەی لەبەر چاویان جوان نانوێنێ، چونکە لە تێگەیشتنی ئەوانەی دوورە و عجائبە لەلایان لەبەرئەوەی هێندە بەسەر ئەو شتە ناشرینانەدا کەوتوون کە خۆیان بەشەرەفی ئەژمێرن و بەگەورەیی ئەزانن، ئێمەش باسمان کرد کە چۆن ئایین ئاشکرای کردووە لەگەڵ بیری تێگەیشتووان، ئەوانە وەکو قالۆنچە وانە کە لە بۆنی گوڵ ڕائەکا و ئەچێتە ناو شتی بۆگەنەوە، هیچ بەدووری مەزانە ئەوانەی کە کرداریان جوان نییە گاڵتە بکەن بەزانای ئیشکەر، یا بیەوێت زیانی پێ بگەیینێ، ئەوەی کە هیچ کەس نایناسێ، بەڵام گاڵتە بەخۆیان ئەکەن و زیان لە سوودی خۆیان ئەدەن، گەردوون ئەوەندە ماوەیان نادات لەو کوێرەوەریەدا کە تێی کەوتوون بگرە خۆشیان خۆیان ناگرن ئەگەر میوەی کرداری هاتەبەر بەکۆمەڵ ڕائەکەن بۆ چنینی و بەشی ئەوەشی لێ ئەدەن کە زیانی پێ گەیاندووە، ئیتر هیچمان لەبارا نامێنێ مەگەر هەر سوپاسی ئەوە بکەن کە ئەو درەختەی ناشتووە و



چاودێری بەرەکەی کردووە، هەرچەندە لەوان خوارتر بێ لەو شتە پڕوپووچانەدا کە نرخی نییە لای پیاوی تێگەیشتوو جا لە تۆڵەی ئەو ئیشە خراپانەدا کە کردوویانە هیچمان بۆ نامێنێتەوە تەنیا ئەوەنەبێ کە لە کردەی خۆیان پەشیمان ببنەوە و خەمی خراپی خۆیان بخۆن و و دڵتەنگ بن بەدڵ کاتێ بەخراپی خۆیان بزانن و بەتەواوی لە کەم و کورتی خۆیان بگەن.

ئە ئەوها چاودێری یەزدانی پاک ئەم گەورەیییە ئەبەخشێ بەخاوەنی ئیشی پیرۆز هەتا زیندووبێ، کاتێ کە ڕۆژی ژیانی لە ئاسۆی ئەم گیێتییەوە گوم بوو، ئەو پڕشنگی ڕووناکییەی ناشارێتەوە کە سارێژی کردووە بەسەر ئەستێرەی ڕێ نیشاندەر و مانگی شەوی چواردەدا، بەڵێ ئەمرێت و ئەچێتە ژێر پەردەی نەمانەوە بە لەش بەڵام هەمیشە لە دڵانا ئەمێن وە بەزمان باسی ئەکرێ، زیندووە لای خوا، خواردەمەنی ئەدرێتێ، ژیانی ئەو شیرینترین ژیانە (و ئەبێ ئادەمیزاد بۆ ئەم جۆرە فرمانانە هەوڵ بدا و تێ بکۆشێ)

* لە گۆڤاری (عروە الوثاق) ی جەمالەدینی ئەفغانی و شێخ محەممەد عەبدەوە وەرگێڕاوە.

## خەیاڵ لەگەڵ کردەوەدا

لە عەرەبییەوە فایەق بێکەس کردوویە بەکوردی

ژنێکە لەسەر مێزی نان خواردنی ئێوارە لەگەڵ مێردەکەیا دانیشتبوو، زۆر عاجز و هیلاک، مێردەکەی وتی: ئەم ئێوارەیە بۆچی وائەکەی؟ وتی بەدەست ئەم منالآنەمەوە هیلاک بووم، بەم ڕۆژگارە دەنگم لەگەڵیان یەت و لێیان ئەدەم بۆ ئەوەی تۆزێ واز لە شەڕەشەق بێنن بەڵام هیچ گوێم لێ ناگرن (بەڕاستی سێ منداڵی زۆر ناڕەحەتی هەبوو، دوو کوڕ یەکێکیان شەش ساڵ ئەوی تریان پێنج ساڵ لەگەڵ کچێکی چوار ساڵیدا). لەگەڵ ئەوەشا کە دایکەکەیان لە بەیانییەوە تا ئێوارە لێیان تووڕە ئەبوو، لێی ئەدان، ئەی ترساندن بەڵام ئەوان لە زرمە زلێی خۆیان نەئەکەوتن کەچی کە ئێواران باوکیان ئەهاتەوە کش و مات دائەنیشتن.

ئینجا کە ژنە ئەم سکالآیەی لای مێردەکەی کرد، مێردەکەی پێی وت هەموو خەتای خۆتە، تۆ لە بەیانییەوە تا ئێوارە لەگەڵیان ئەلێیت سیوایان بۆتەوە، تۆ گوێ بگرە مەقالەیەکی تازە لە بابەت تەربیەوە نووسراوە بۆت بخوێنمەوە، دەستی کرد بەخوێندنەوە:

(منداڵ دانەنراوە بۆ دایک و باوک کە بەهەوەسی خۆیان هەڵی سوڕێنن بەڵام منداڵ دانراوە بۆ ئینسانییەت و نیشتمان وە یاخود ئەبێ موڵکی نەفسی خۆی بێت).

لێرەدا سەری هەڵبڕی بەژنەکەی وت: چاوت لێیە؟ ئێستا ئەم سێ منداڵە نەدراون بەئێمە کە بەهەوەسی خۆمان لەگەڵیان بجووڵێینەوە چونکە هەریەکە شەخسیەتێکی هەیە، ئنجا دەستی کردەوە بەخوێندنەوە: (زۆر جار دایک ئەبێت بەهۆی ئەوە کە منداڵ لە دایک و باوک ببێزرێ چونکە دایک لە قانوونی تەبیعەت سەر دەرناکا، هەموو جارێ منداڵەکان حەپس ئەکا لە ژوورەوە نایەڵێ بچنە دەرێ بەهەوەسی خۆیان یاری بکەن و ڕابوێرن و خۆیان بەدووی قانونی تەبیعەتدا بڕۆن!!).

لێرەدا مێردەکەی وتی: گوێت لێیە بەتەبیعەت ئەبێت منداڵ یاری و گاڵتە بکا چونکە بەیاری و تاقی کردنەوە و غەڵەت کردن فێر ئەبێ.

دەستی کردەوە بەخوێندنەوە:

(ئەبێت واز لە منداڵ بهێنرێ کە خۆی هەمووشتێک تاقی بکاتەوە، نابێ نەیەڵن یاری بکا چونکە بە یاری کردن توانای خۆی دەرئەخا و پێ ئەگا، لێرەدا مێردەکەی ویستی ئەمە



بۆ ژنەکەی لێک بداتەوە بەڵام کە ڕوانی ژنەکەی خەو ئەیباتەوە پێی وت: باش بوو بەشی زۆرم بۆ خوێندیەوە، خۆشت بەیانی تەواوی بکە. ئیتر لەمەولا لەم منداڵانە تووڕە مەبە و وازیان لێ بهێنە بەئارەزووی خۆیان بجووڵێنەوە چونکە بەوە شەخسیەت پەیدا ئەکەن. بۆ بەیانی پاش نیوەڕۆ کە پیاوەکە هاتەوە تەماشای کرد دەرگای باخچەکە لەو دیوەوە بەرد و خۆڵی دراوەتە بەر ناکرێتەوە. لەبەرئەوە بەدیوارەکەدا سەرکەوت، کە ڕوانی باخچەکە وێران کراوە و بەلوعەکە بڕدراوە و حەوشەکە بووەتە زۆنگاو، زۆر سەری سوڕما، کە دەرگای ژوورەکانی کردەوە ڕوانی هەمووی بەسەر یەکا دراوە.

بەیەک جار حەپەسا، سەیری کرد نە کەس ئەبینێ و نە دەنگ ئەبیەت. کە چووە پێشەوە گوێی گرت تێگەیی کە ژنەکەی لە ژووری نان خواردندا دەرگاکەی لەسەر داخراوە، هەر هاواری منداڵەکانییەتی لێی بکەنەوە. چووە پێشەوە بانگی کرد چی قەوماوە پێم بڵێ: وتی: کە بەیانی مەقالەکەم خوێندەوە وتم ئیتر لەمەولا لەسەر ئەم نەزەریەیە ئەڕۆم لەبەرئەوە منداڵەکان هەرچییەکیان کرد دەنگم نەکرد، باخەکەیان وێران کرد، ژوورەکانیان دا بەسەریەکا، دەرگای ئەم ژوورەشیان لەسەر من داخست.

وتی: ئەی کلیلەکە لە کوێیە؟ ژنەکە وتی: ڕەنگە لەگەڵ خۆیان بردبێتیان. پیاوەکە بەڕاکردن چوو بەشوێنیانا کە ڕوانی وا لەسەر کۆڵانەکەدا بەشوێنی ئۆتومبێلی ئاوڕشێنەکەوەن هەموو لەشیان تەڕ و قوڕاوی بووە. ڕایکێشانە ماڵەوە کە ڕوانی کلیلەکە لە گیرفانی گەورەکەدایە، دەری هێنا، پێی وتن: دایکتان بۆچی حەپس کردووە؟

وتیان: ئێمە دز دزێنەمان ئەکرد، ئێرە پڕبوو بوو لە دز و پۆلیس لەبەرئەوە کە دایکمان هیچی لێ نەیە دەرگامان لەسەر داخست. وتی ئەی ئەم ماڵەتان بۆ وا لێ کرد؟ وتیان ئەی دز لە کوێوە ڕاکا و پۆلیس چۆن شوێنی کەوێ؟ ئنجا مێردەکە دەرگاکەی کردەوە و ژنەکەی سەیرێکی مێردەکەی کرد و سەیرێکی منداڵەکانیشی کرد، مێردەکەی سەری داخست وتی: هیچ ناڵێم، حەقتە، ئەبێت ئەو عالمەی کە ئەم نەزەریەیەی نووسیوە خۆی منداڵی نەبێت خەیاڵ و نەزەریە لە کوێ؟! کردەوە لە کوێ؟!.

## دوو کوژراو لە پێناوی شوودا

فایەق بێکەس لە عەرەبییەوە کردوویە بەکوردی

دوێنێ شەو بەدرێژایی شەو خەوم لێ نەکەوت چونکە لە هەر چاو لێک نانێکما ناڵەیەکی پڕ ئێش کە لە دەروونی ژنێکی کەساس و بێ دەرەتان کەوا بەدەم ئێشێکی زۆرەوە بتلێتەوە ئەهاتە دەرێ، ڕای ئەپەڕاندم، بەیانی زوو کە ڕۆژ بووەوە چوومە ئەوماڵەی کەوا بەتەنیشتمانەوە بوو و ئەو دەنگەی لێ ئەهاتە دەرێ کە ڕوانیم ژوورێکی تاریکی بچووکی تیایە و لەو ژوورەشا تەنها جێگایەکی هەژارانە ڕاخرابوو، ژنێکی نەخۆشی ڕەنگ زەردی لەسەر ڕاکشابوو. بەهێواشی چوومە پێشەوە بەڵام ئەو هەستی منی کرد و چوومە لایەوە گوێم لە نوزەیەک بوو وتی (ئاو)، هەرچۆنێک بوو چۆڕێک ئاوم بۆ پەیدا کرا و کردم بەدەمیا، باش بوو بەوە نەختێک دەمی هاتە گۆ، پێم وت: چیت لێ قەوماوە زوو پێم بڵێ؟!

بەدەنگێکی هێواشی پچڕ پچڕ وەکو لە گیانەڵا وابێ: باوکم دامی بەشوو، بەپیاوێکی لە ژن بێزار، ژن زۆرهێنەر، ئاخێکی هەڵکێشا و وتی ئاخ، لە کچ بەشوودانا خۆزگە پرسیارێکیان بەکچە خۆی ئەکرد، من ئەگەر ئەمەم ئەزانی لە پێش ئەوەدا کە بەزۆرەملێ باوک و برا بمدەن بەم پیاوە هەر شووم نەئەکرد، تەرکی دنیام ئەکرد و ئەبووم بەراهبە. بەڵام چی بکەم ناچاربووم پەسندم کرد. لە ئەوەڵ ڕۆژدا هات بەپیرمەوە وەکو مێردێکی دڵسۆز و لەگەڵما زۆر ڕووخۆش و دەم بەپێکەنین بوو، هەر بەو ڕووخۆشی و پێکەنینەش لە دواییدا تۆقاندمی، تەراندمی. وەکو چۆن شێر بەپێکەنین نێچیرەکەی ئەتۆقێنێ ئیتر زۆری پێ نەچوو وام لێ هات هەر چاوەڕێی ئەوەم ئەکرد کەی جیابێتەوە؟ ئەوەندە درێژەی نەکێشا ئەو ژنێکی تری هێنا و منی لەبیر چووەوە. منیش لەگەڵ کچە بچکۆلەکەما بێکەس و هەناسە سارد مامەوە. بەڵام ناچار شانم دایە بەر ئەم خەم و خەفەت و کوێرەوەریە چونکە هەرچەند سەرم ئەبرد و سەرم ئەهێنا شتێکی وام نەدۆزیەوە کە خۆمی پێ ڕزگار بکەم ئەوەنەبێ کچەکەم هەڵگرت و چوومەوە ماڵی باوکم لەوێش کە ڕوانیم باوکیشم کەوتووە بەدەم دەردەوە ئەتلێتەوە خۆ کە چاویشی بەمن کەوت ئەوەندەی تر دەردی گران بوو هەروا دوو ڕۆژی بەسەرا نەڕۆی کۆچی دوایی کرد.

ئینجا زانیم لە ئەزەلدا فەلەک چەند ڕۆژێکی تاریک و ناخۆشی لە چارەم نووسیوە، بەڵام نازانم کەی ئەبڕێتەوە، چی تریشم بەسەردێ، بەم ڕەنگە کەساس و بێ دەرەتان



مامەوە ناچار هانام بردە بەر باوکی کچەکەم کە هیچ نەبێ لەبەر خاتری کچەکەی بمانژیەنێ و هۆمان نەخاتە بەر بێگانە بەڵام بێ سوود بوو گوێی لی نەگرتم.

بەزۆر دەستم کرد بەگۆرەوی چنین تا بتوانم ئەو کچە بچکۆلەیە بەخێو بکەم بەڵام تەماشام کرد ئەویش بێ کەڵکە ئنجا دەستم کرد بەشت فرۆشتن تا وام لێ هات لەم دەستە نوێنە شڕە زیاتر هیچ شک نابەم.

لەبەرئەوەی ناچاربووم مانگێک لەمەوپێش کاغەزێکم بۆ مێردەکەم نووسی، ئەم حاڵەی خۆمانم تێ گەیاند زۆر لێی پاڕامەوە کە ڕزگارمان کا.

وا لەو ڕۆژەوە چاوم ڕوا هەر چاوەڕێی ڕەشاییەکم کە لەسەر ئاوەکەوە دەربکەوێ. شەوێک لەم شەوانەدا لەم ژوورە تاریکەدا دانیشتبووم کچەکەم لە باوەشابوو سەیری ڕووی ڕووناکی ئەو کچە نازدارەم ئەکرد وەکو پاپۆڕەوانێک لە شەوێکی تاریکا سەیری ئەستێرەی قوتب بکا ئەوەندەم نەزانی لەپڕ ئەو زۆردارە، ئەو بێ ڕەحمە، ئەو خوانەناسە کردی بەژوورا و پەلاماری دام و کچەکەی لە دەست فڕاندم و ڕۆیی. منیش بێ کەس و بێ دەسەڵات، هەناسە سارد لە گریان و هەناسە هەڵکێشان بەولاوە هیچم پێ نەکرا بەڵام ئەویش بێ کەڵک بوو چونکە نە کەسێک هەبوو بەزەیی بەفرمێسکەکانما بێتەوە و نە یەکێک هەبوو گوێ لە هاوارم بگرێ.

ئینجا بۆم ئاشکرابوو کە فەلەک بەو تیرەی کە بۆی دانابووم و چەند ڕۆژێک بوو خەریک بوو تێم بگرێ ئەنگاوتمی، هەر چۆنێک بوو ئەو شەوە و نزیکەی بیست شەوی کەشم بەم حاڵەوە ڕۆژ کردەوە ئێستاش ئەوەندە هەیە کە لەم تاریکستانەدا چاوم ئەچێتە خەو کچە بچکۆلەکەم دێتە بەرچاو ئەگری، هاوار ئەکا، بانگم ئەکا باوکیشی لێی ئەدا، فڕێی ئەدا گوێی ناداتێ.

منیش خەریکم پەلاماری ئەدەمێ کە ڕزگاری کەم خەبەرم ئەبێتەوە لام وایە کە یا ئێستا یا تاوێکی تر ئەم دنیایە بەجێ دێڵم چونکە وا گیان گەیوەتە سەر سنگم بەڵام ئاخ ئەم دنیایە بەجێ دێڵم بێ ئەوەی کە جارێکی تر چاوم بەو کچە ناسک و نازدارەم بکەوێتەوە. ئەمانەی تەواو نەکرد و هەردوو چاوی کردەوە خەریک بوو قسە بکا بەڵام نەیتوانی چاوی پڕبوو لە فرمێسک و لێکی نایەوە منیش کە چاوم بەم حاڵە کەوت خۆم بۆ ڕانەگیرا و دەستم کرد بەگریان.

لەم ساتەدا بەم چاوە فرمێسکاویەوە تارماییەکم بەدی کرد، کە چوومە پێشەوە ڕوانیم

پیاوێک وەستاوە کچێکی بچکۆلەی بەباوەشەوەیە زۆر بەسۆزەوە سەیری ئەکا و کچەکەش وەک مردبێ هیچ ناجولێتەوە پرسیم تۆ کێی؟! وتی من مێردی ئەو ژنەم، باوکی ئەم کچەم، وتم لەپاش ئەم هەموو دەرد و کوێرەوەریە کە دات بەم ژنە و ئەم مندالّەت لێی دوور خستەوە ڕەنگە هاتبی کە لێت ببورێ، وتی ئەوەتەی ئەم کچەم بردووە هەر ئەزریکێنێ و هاوار ئەکا و ئەگری و داوای دایکی ئەکا و نەخۆشیش کەوت، چەند دکتۆرم بۆ هێنا بێ کەڵک بوو، وا ئێستا هێناومە بەڵکو لە کۆشی دایکیا چاک بێتەوە، بەهێواشی چووە پشتیەوە و کچەکەی خستە باخەڵی دایکەکەیەوە، دایکە چاوی کردەوە و سەیرێکی کچەکەی کرد و کچەکەش هەروا بانگی یەکتریان کرد. دایکەکەی باوەشی کرد بەکچەکەیا و نای بەسنگیەوە بەڵام هەردووکیان چاویان لێکنا و گیانیان سپارد. وا دیارە چاوەڕێی یەکتر بوون.

چووین ئەو دوو کوژراوەمان ناشت. بەڵێ ئەو دوو کوژراوە کە ئەو پیاوە زۆردارە کوشتنی.

ساڵی هەزارانی وا بەهۆی شووکردنێکی واوە ئەم جۆرە پیاوانە ئەیانکوژن.



## أ، ب . هەوری لە تای تەرازووی شیعرا

نووسینی -فایەق بێکەس-

ئەم گۆڤاری گەلاوێژە کە ئەستێرەیەکی بەشەوق و پڕشنگدارە لە ئاسمانی ئەدەبیاتی کوردا، داخەکەم جار جار هەندێ شتی ناشرینی تیا ئەبینرێ کە ئەبێتە پەڵەهەور بەری ڕووناکی و درەوشانەوەی ئەو ئەستێرەیە ئەگرێ، ئەو دیمەنە جوانە دڵدارە لەچاو ئەشارێتەوە کە بەمەش لەجیاتی ئەوەی خۆشی ببەخشێ بەپێچەوانەی ئەوە دڵی خوێندەواران تەنگ ئەکا.

لێرەدا نازانین گلەیی لە کێ بکەین؟ لەو کەسانەی کە شتی وا بێتام و ناپوختە ئەنێرن بۆ ئەم گۆڤارە نازدارە یا لەو کەسەی بکەین کە سەرپەرشتی گەلاوێژی گرتۆتە دەست؟ ئەگەر چی گەلێ لە خوێندەوارەکان لایان وایە کە ئۆباڵی ئەم کەم و کوڕیە لەسەر شانی ئەو کەسەیە کە سەرپەرشتی گەلاوێژ ئەکا، بەڵام من لام وایە ئەمە ڕەوای هەق نییە، چونکە لە گەلاوێژا بەشێک تەرخان کراوە بۆ لێکۆڵینەوە کە هەموو کەسێ هەقی هەیە بەشێوەیەکی ئەدەبی جوان کە لە سنووری نزاکەت دەرنەچێ چ لە شیعر و چ لە وتار بکۆڵێتەوە و لێی بدوێ.

بەم بۆنەیەوە ئێمەش وا ئەمە ئەنووسین ئەمجارە لە ژمارە (١) ساڵی (٥) لە دیوانی گەلاوێژدا لەژێر عنوانی «پەیڕەوی خیام»دا چاومان بەچەند ڕباعییەک کەوت لە لایەن أ.ب هەورییەوە ڕێک خرابوو، نەک من بەتەنیا هەر چی خوێندەواران هەیە هەموو لەم شیعرانە بێزار و وەرس بوون و زبانی حاڵی هەموومان بەجارێ ئەڵێت (خیام گور هەڵتەکێنە أ.ب هەوری وەها پەیڕەوت ئەکا) ئینجا سەرنج بدەنە ڕباعیەکانی أ.ب هەوری بزانن ئەڵێ چی. لە یەکەم ڕباعیا ئەفەرموێ: (من کە بێ پرس بێمە دنیاوە هەر بەناچاریش بچمەوە دواوە کوێم مەیل بینی ڕوو لەوێ ئەکەم چ لە سەگ وەڕ و لە بەنگ و باوە) جارێ لە پێش ئەمەدا کە بۆ مەعنای ئەم ڕباعیە بگەڕێین ئەگەر مامۆستا أ.ب هەوری لێمان ببورێ ئەیخەینە تەرازووی شعرەوە، لە پاش کێشانی بۆمان دەرئەکەوێ کە مصرەعی یەکەمی لەنگە، ئەبوایە وابوایە (من کە بەبێ پرس ... هتد)، خۆ ئەگەر بۆ مەعناش بگەڕێین ئەوە هیچ، چونکە ئەڵێت: (کوێم مەیل بینی ڕوو لەوێ ئەکەم) ئەمە ڕاست نییە، گریمان مامۆستا أ.ب هەوری ئارەزووی فەرموو بچێتە لەندەن، پاریس، ئەمریکا، چۆن ئەتوانێ؟ و بەچی ئەچێ، چونکە نە پارە و نە توانای ئەوەی هەیە کە ئەو

ئارەزووەی بەجێ بهێنێ کەوابوو ئەم قسەیە ڕاست نییە، جگە لەوە مصرەعی چوارەمی کە ئەڵێ: (چیمە لە سەگ وەڕ لە بەنگ و بەنگ باوە) زەوقێکی ئەدەبی تیا نییە چونکە ئەبێ مۆسیقایەک بێ عاتیفەی ئینسان ببزوێنێ و مەست و شادی بکا، نەک بە(سەگ وەڕ) گرژ و زنجیرەی بکات، سەرەڕای ئەمە (بەنگ و باو) نییە (بەن و باو)ە. بێینە سەر ڕباعی دووەم تەماشاکەن چی ئەفەرمووێ: چۆنم هێناوە وای ئەبەمە سەر بەندەی کەسێکم ڕاست و هونەروەر، قسەی نەزان و پیاوی ڕیاکار لای من گەفینە یا زەڕینی کەر. تکاتان لێ ئەکەم خوێنەرە بەڕێزەکان لەم ڕباعیەدا چەند عەیبێکی فەلسەفی تێدایە کە لە بیری خیام بچێ؟ ئایا (گەفینی سەگ و زەڕینی کەر) کە هاوتای بیری قووڵ و وردی خیام بکات؟ من نازانم أ.ب هەوری ڕقی لە خیام هەستاوە کە خەریکە بەم ڕەنگە ئابڕوی بەرێ یا لە گەلاوێژ یا لە خۆی؟ با لە ڕباعی سێیەم وردبینەوە کە ئەڵێت:

کەلاوە کۆنێ کە دەنیای ناوە
چۆن دڵی پێ خۆش کەم مشتێ کا و ئاوە
کەی و مورز و دارا و سکەندەر
هاتن و ڕۆین کەچی ئەو ماوە

لێرەشدا ئەگەر باش سەرنج بدەین ئەبینین مصرەعی دووەم لەنگە و، لە لایەن مەعناشەوە زۆر بێ مەعنایە چونکە کا و ئاو هیچی لێ پەیدا نابێ یەک ناگرن و دنیاش عیبارەتە لە گڵ و ئاو نەک کا و ئاو.

لە ڕباعی چوارەمدا ئەڵێت:

ئەوی بۆ کورسی خەڵک ئەڕەنجێنێ
خونچەی شادمانی هەڵ ئەوەرێنێ
گا، بوایە بەخوا زۆر چاتر بوو
کەژ و کێو زۆرە زک بلەوەڕێنێ

لێرەشدا لە پێش هەموو شتێکا دیارە کە مصرەعی سێیەم و چوارەم لەنگن جگە لەوەش قسەیەکی مەنتیقی لەم ڕباعیەدا نابینرێ،توخوا ئەی خوێندەواران تکاتان لێ ئەکەم کێ بۆ کورسی خەڵک نارەنجێنێ و ئەوە تەتی دنیا دنیایە ئەم هەموو شەڕ و هەرایە کە ڕوو ئەدا هەمووی لەسەر کورسیە یا نا؟ بەڵێ بێگومان ئەتوانن بڵێن کە ئەم هەوڵ و تەقەلایەی کە ئەدرێ بۆ کورسی غەریزەیەکی تەبیعیە لە ئینساندا بۆ ئەوەی سەری خوێندەواران زیاتر



نەیەشێنین واز لە ڕباعی پێنجەم ئەهێنین خۆیان چۆنی لێک ئەدەنەوە لێکی بدەنەوە و، بەتایبەتی تکا لە مامۆستا أ.ب هەوری ئەکەم لەم قسانەم دڵگیر نەبێ چونکە ئەمە خزمەتێکی ئەدەبییە لەسەر هەموو ئەدیبێکی دڵسۆز پێویستە لەم ڕووەوە دریغی نەکات و، دووبارە تکات لێ ئەکەمەوە لە پێش ئەوەدا کە شت بنێری بۆ گەلاوێژ جوان سەیری بکە و باش سەرنج لە وەزن و مەعنای بدە و، پوختی بکە ئەوسا بینێرە، چونکە گەلاوێژ حەیفە بەناشیرینی بکەوێتە بەرچاوی دۆست و دوژمن، ئیتر خوا یاریدەدەری هەموو لایەک بێ.

## وەرام بۆ ف. بێکەس

أ.ب هەوری

مامۆستا ف. بێکەس لە ژمارە (٢)ی ساڵی (٥)ی گەلاوێژا ڕەخنەتان لەو شیعرانە گرتبوو کە ئێمە لەژێر عنوانی «پەیڕەوی خیام»دا بڵاومان کردبووەوە، ئەمە وەرامەکەتانە:

١- جارێ ڕەخنەتان لە عنوانی شعرەکان گرتبوو، وا لەبەر ئێوە وەرامەکەتان ئەدەمەوە ئەگینە شتی وای تێدا نییە: هەموو کەس ئەزانی یەکێ کە ناو لە شتێک ئەنێ لەسەر ئیجتهاد و ئارەزووی خۆیەتی بەتەواوی بۆ ئەوە نییە ئیسم و میسمی موتابق بێ، مەسەلەن پیاوێک کوڕەکەی ناو ئەنێ (صلاح الدین) کەچی ئەو کوڕە ئەبێ بەجوتیار، ئەمە چ گوناهێکی باوکی تێدایە کە نەبوو بە سەلاحەدینی مەشهور، من کە ناوی خیامم هێناوە هاوبیری خیامم ئەگەر وابوایە ئەبوو هەمیشە لە مەیخانەدا بوومایە، وەک مفکورەی ئێوە ئەفەرموی ئەبێ «هەرکەسە ڕیشی سوور بێ هەمزە ئاغا بێ» لە ئەمریکادا بەهەزاران «روزفلت» ناو هەیە ئەی بۆچ هەموو ڕەئیسی جمهوری نین؟ بێجگە لەمەش قاعدەیەک هەیە (کل) بەناوی (جۆ)ەوە ناو ئەبرێ. لەو ڕباعیانەدا هینی وای تیایە لە شێوەی ڕباعیەکانی خیام، بۆیە هەموو شیعرەکان بەو ناوە ناوبراوە.

٢- من لە پێش ئەوەدا ئەو شیعرانە بنێرم بۆ گەلاوێژ لە پێش ئەوەشدا ئێوە بڵێن، نیشانی چەند کەسێکم دابوو بەپێچەوانەی ئێوە ئەوان بەلایانەوە چاک بوو، ئەوەتان بۆ نەچووە سەر کە وتبووتان «نەک من بەتەنیا هەرچی خوێندەوار هەیە هەموو لەو شیعرانە بێزار و وەرس بون» ئەمێنێتەوە سەر ئێوە و هاوبیرەکانت بەتەنها ئەوەندە وەکالەتێکی عام قبوڵ ناکرێت.

٣- ڕەخنەت لە شیعرەکانە کە نەزاکەتیان کەم تیایە کەچی ڕەخنەکەت درۆزنیش نەزاکەتی تیا نادۆزێتەوە، بێجگە لەمەش ئەم ڕەخنەیەت ڕاستەوخۆ بۆ زمانی کوردییە، چونکە زمانەکەمان بێ پێچ و پەنایە بەسەربەستی شت ئەڵێت، بۆ ئیسپاتی ئەمەش وا چەند قسەیەکی پێشینان ئەنووسین کە وەختی خۆی لە ژیان و گەلاوێژیشدا نووسراون و لە نەزاکەتدا هەروەک هینەکانی من وان، جا نازانم بۆچ ئەو حەلە ئەم ڕەخنەیەت نەگرت و نەتفەرموو ئەم قسە و پەندی پێشینانە نەزاکەتیان تیا نییە، وازیان لێ بێنن با لەبیر بچنەوە:



«نان بدە بەسەگ مەیدە بە سپڵە» لێرەدا سەگ تەرجیح دراوە بەسەر سپڵەدا. «دار هەڵبڕە سەگی دز دیارە» ئەمەش هەر مەبەست ئینسانە. «هەمزە لە هەباسی چی... لە تەورداست چی» ئەمانە قسەی پێشینانە بەرەکەتدا زۆر کەس ئەیزانن، ڕێی ئەوەت نییە بڵێیت توخوا خوێندەوارینە کەی ئەمانە کوردین، چونکە لای تۆ وایە «ئەوی تۆ مانای نەزانی کوردی نین» و یان بڵێیت لە هەر پیرەژنێکم پرسی پێکەنی، بۆچ؟ پیرەژن قاموسی ژیانی کوردین؟ علاوەی ئەمانەش زۆر گفتوگۆی وامان هەیە ئەمڕۆ لەم شێوەیەدان، مەسەلەن کە وترا «بەخوا زۆڵە» یەعنی بەخوا زیرەکە، من بڵێم چی ئێوە بەزمانی خۆتان ڕازی نابن و شێوەی گفتوگۆی کوردیتان پێ عەیبە، ئەو بێگانەیەی گەلاوێژ ئەخوێنێتەوە عەیبی لێ ئەگرێت ئاگای لە گفتوگۆکانیشمانە.

ئینجا بێینەوە سەر کاری ڕەخنەکانت لە ڕباعییەکان.

بۆ ڕباعی یەکەم بێ دەلیل فەرمووتە مصرەعی یەکەمی لەنگە، ئەگەر دەلیلتان بدایە منیش بە دەلیلەوە وەرامم ئەدایتەوە بەڵام وەک تۆ هەر ئەڵێم لەنگ نییە.

دوای ئەوە مەعنای «کوێم مەیل بینی ڕوو لەوێ ئەکەم» مادام جێگە و هەدەف مەعلوم نییە تۆ ناتوانی بەباری موستەحیلات و خراپەدا مەعنای لێک بدەیتەوە، تۆ هەر وەکیلی هاوبیرەکانی خۆتی وەکیلی من نیت.

بۆ وەرامی ڕباعی دووەم ئێستەش ئەڵێم دەنگی جوانێکی بەسەزمان کە هەموو ژیانی لە ڕێی خزمەتی ئینسانیەتدا سەرف ئەکات خۆشترە لەلام لە دەنگی ئینسانی درۆزنی ڕیاکاری بەدنمەکی سپڵە بۆ ئینسانیەت.

لە ڕباعی سێیەمدا ڕەخنەت ئەوەیە دنیا گڵ و ئاوە، کا و ئاو نییە، من ئەڵێم ئەو ڕباعیە بۆ خوێندەوارێک کە ئەزانێ (مشبە و مشبە بە) زۆر جار یەکێکیان ناو نابرێ بەقەرینە ئەویتریان ئەزانرێ و هەروەها ئەو شتانەش کە لازم و ملزم بن زۆر جار هەموویان ناو نابرێن، کە یەکێکیان وترا خوێندەوار لە خۆیەوە ئەویتریان ئەزانێ، بۆ قوڕ، کا، گڵ، لازمن کە دووانیان مەوجوود بوون سێیەم ناوبردنی هیچ مانای نییە، توخوا کێ هەیە بێ بڵێت ئەوە کا، ئەوە ئاو، هەندێ قوڕ بگرەوە نەزانێ گڵیش لازمە؟! بێجگە لە مصرەعی پێشو لە شیعرەکەدا «کەلاوە» هەیە کە قوڕ لە لوازماتیەتی وەک وتمان کا، ئاو، گڵیش لوازمی قوڕن، علاوەی ئەمانەش مەجال جائزە بۆ تەسەڕوف لەبەر قافیە.

بۆ کورسی خەڵک ڕەنجا بن: مەبەست ئەوەیە یەکێ لە ڕێگەیەکی غەیرە مەشروع بۆ

بەرزی خۆی هەوڵ بدات، یا لە ڕێی گەیشتن بەو بەرزییەی وا هەزاران کەم دەس و هەژار لەناو بچێت و حقوقیان بکرێت بەژێر پێوە کە ئەمەش تەماعکاری پێ ئەڵێن و حەقێکی مەزمومە، مەبەس ئەوە نییە بەتەریقەیەکی مەشروع هەوڵ بدات کە بەعەرەبی (طموح)ی پێ ئەڵێن و شتێکی جوانە، کەوابوو تۆ بەپێچەوانە ئەمەشتان وەرگرتووە.

مامۆستا ف. بێکەس وا وەرامی ڕەخنەکانم دایتەوە تکام وایە لێم ببووری وەک من لە تۆ بووردم.



## پێشکەشی مامۆستا أ. ب هەوری

ف. بێکەس

مەبەس لە ڕەخنەگرتن لە شیعر و ئەدەبیات ئیسلاح و ڕێگا نیشاندانە نەک شەڕە قسە، بەوەڵامەکەی گەلاوێژی ژمارە (٤) ساڵی (٥)تانا وا دەرکەوت کە دڵگیر بوون منیش وام بەئێوەدا ڕانەئەپەرمو کە ئەوەندە کەم چیکلدانە بن ئامۆژگاریەکانم بەخراپ تێ بگەن، ئایا نەت بیستووە کە پێشینان وتوویانە: (دۆستم ئەوەیە کە ئەمگرییێنێ). جا بابێینەوە سەر کاری وەڵامەکەت.

من خوانەخواستە چۆن بەتۆ ئەڵێم خۆت ناو ناوە (عومەر خەیام)، مەبەستی من ئەوەبوو کە کەسێ پەیڕەوی کەسێکی کرد ئەبێ یا شان بەشانی ئەوکەسە بڕوا بەڕێدا یا هیچ نەبێ نەختێ لەو بچێ، خۆ بەناشوکری نەبێ شیعرەکانی ئێوە هیچ فرێکی بەسەر شێوە و بیر و ئسلوبی خەیامەوە نییە، تکات لێ ئەکەم پێم بڵێ کام ڕباعی لە ڕباعیەکانت لە هی خەیام ئەچێ؟ و ئەو کەسانە کێن نیشانت داون کە خۆت وتووتە؟ ئایا نیشانی (زێوەر، بێخود، پیرەمێرد، سەلام، شێخ نوری)ت داوە؟ ئەگەر ڕاست ئەفەرمووی پێم بڵێ وەکو من بزانم تەنها بۆ سێ چوار کەسێکی نەشارەزات خوێندۆتەوە کە بە(باشە)ی ئەوان دەس خەڕۆ بوویت و لە گەلاوێژ بڵاوت کردۆتەوە.

بۆ ئەمەی زۆر درێژەی پێ نەدەین ئەم داوایەمان کە عبارەتە لە چاکی و خراپی ڕباعیەکانت کە لە گەلاوێژی ژمارە (٢) ساڵی (٥)دا نووسراوە حەواڵەی وجدانی شاعیر و ئەدیبانی کوردی ئەکەین و بەپەرۆشەوە تکایان لێ ئەکەین کە بیر و باوەڕی خۆیانمان لەلایەن ئەو ڕباعیانەوە لە گەلاوێژا بۆ بنووسن کە بەتەواوی پێ لە ناتەواوی شیعرەکانی خۆت بنێی و جارێکی تر تووشی هەڵەی وا نەبیت.

جەنابی مامۆستا أ.ب هەوری، ڕەخنەکەی من وەکو فەرمووتانە بۆ ژیانی کورد نییە تەنها شیعرەکانی تۆیە کە ڕەونەق و نرخی ژیانی کوردی شکاندووە و هەرکەس بیخوێنێتەوە بەهۆی ئەوەوە (نەفرین) لە هەموو شیعرێکی کوردی ئەکا، ڕەنگە ئێوە وا بزانن کە شیعرەکانتان نموونەی بەلاغەت و فەساحەتی ژیانی کوردییە و هەرکەسێ ڕەخنەی لێ بگرێ وەکو ڕەخنەی لە ژیانی کورد گرتبێ وایە ئەگینا کەی من ڕەخنەم لە ژیانی کورد گرتووە و، چۆن من قسە و پەندی پێشینان بەناشیرین ئەژمێرم؟ چونکە هەر کەسە نەختێ

تێگەیشتبێ ئەزانێ ئەوانە هەموو نایابن و لە جێگای خۆیا بەکارهێنراون. تێناگەم ئەمە چ دەخلێکی هەیە بەسەر ڕباعیەکانی تۆوە، ڕاست بۆ ئەمەبوو (هەمزە لە هەباست چی... لە تەور داست چی)

کاکە أ. ب هەوری:

نازانم جەنابت چ نەوعە دەلیلێکت ئەوێ کە نیشانت بدەم و لەنگی ئەم مصرەعە (من کە بێ پرس بێمە دنیاوە)، ئەگەر نەختێ زەوقی ئەدەبیت بێ ئەبوایە بتزانیایە کە لەنگە، جگە لەوەش ڕباعیەکانی تۆ کە لەسەر ئاهەنگی (مستفعلاتن مستفعلاتن)ە، فەرموو ئەم مصرەعەی پێ بکێشەوە بزانە چۆنە و ئەگەر باوەڕ بەوەش ناکەی هەروەکو لە پێشەوە عەرزم کردی لەنگی و کەم و کوڕی و بێ مانایی ڕباعیەکانم حەواڵەی ڕای شاعیر و ئەدیبەکانی کورد کردووە ئەوان وەڵاممان ئەدەنەوە.

جەنابت ئەفەرمووی کە من (دەنگی حەیوانێکی بەسەزمان کە هەموو ژیانی لە ڕێی خزمەتی ئینسانیەت سەرف ئەکات خۆشترە لەلام لە دەنگی ئینسانی درۆزنی ڕیاکاری بەدنمەکی سپڵەی مضر بۆ ئینسانیەت) کەچی بەپێچەوانەی ئەوە لە ڕباعیەکەتا ئەڵێی:

(قسەی نەزان و پیاوی ڕیاکار * لای من گەفینە یا زەڕینی کەر)

لەم ڕباعیەدا وادیارە کە تۆ تەنەفور ئەکەی لە گەفینی سەگ و زەڕینی کەر، چونکە وەکو قسەی نەزان و پیاوی ڕیاکار وایە کەچی لەلایەکی تریشەوە لە وەڵامەکەتا خراپ، ئەمە چی بەسەر چیبیەوەیە؟ هەر خۆت خۆتت ڕد کردەوە.

– ئێمە کە مناڵ بووین لە مەکتەبا خوێندوومانە ئەرز دوو بەشە (١) ئاو (٢) گڵ (وشکایی)، ئەمان بیستووە کە سێ بەشە ئاو، گڵ، کا، ئافەرین مامۆستا أ.ب هەوری بۆ خۆت و نەزەریەی تازەت کەوا ئینقلابت دا بەعیلمی جوگرافیا. ئەمەش ئەخەینە پێش چاوی مامۆستایان و زانایان بزانن ئەوان چی ئەفەرموون.

مامۆستا أ.ب هەوری، وابزانم بەم قسانە نەختێ سەرمان یەشانی لێمان ببورە، تکا ئەکەم ئەمجارەش وەکو جاری پێشوو قسەکانم بەخراپ وەرنەگرن.



## سەرنجدانێ لە (ئەدەبیاتی مەنگوڕی)

ف. بێکەس

ئەوەندەی لە گەلاوێژدا بەشی لێکۆڵینەوە تەرخان کراوە من زۆر تووشی دەردیسەری و ناخۆشی بووم، باوەڕم پێ بکەن لە ژینی خۆم بێزارم هەروەکو پێشینان وتوویانە (دارێکم بەدەستەوەیە هەردوو سەری...) نازانم چی بکەم؟ ئەگەر ڕەخنەم لە شیعری کەسێ گرت ئەو کەسە لە خۆڕایی لێم ئەبێتە دوشمنیی بەخوێنی سەرم تینوو، چونکە داخەکەم ئێمەش هێشتا لە مانای (ڕەخنەگرتن) نەگەیشتووین، بەجنێوی ئەزانین، ئەگەر قسەش نەکەم و هەر چیپەکم دی چاوی لێ بنوقێنم و بەسەریا بڕۆم و گوێی نەدەمێ ئەوەش نابێ، چونکە زۆر بەگوناهێکی گەورەی ئەژمێرم ئەگەر ئاوەڵێکم ڕێگا هەڵە بکاربیی نیشان نەدەم و نەیخەمە سەر شەقامی ڕاست بەشەرتێ خۆشم شارەزای ئەو ڕێگایە بم، جا لەبەر ئەمە کە باسم کرد سەرم لێ شێواوە زۆر خراپ داماوم نازانم چی بکەم؟! لەگەڵ ئەوەشدا من گوێ نادەمە هیچ کەس و لە ڕەخنەگرتن هەتا پێم بکرێ دەس هەڵناگرم، چونکە بەپێویستی ئەزانم لەسەر شانی خۆم بۆ بەرزکردنەوەی ئەدەبیاتی کوردی هەتا لە تواناما بێ هەوڵ بدەم و دریغی نەکەم، خۆ یەجگار لەم ڕۆژانەدا خوا بێ چاوینیان بکا ئەوەندە (شاعیری تازە کوورە) پەیدا بووە لە ژمارە نایە، پیاو نازانێ لە کامیان بکۆڵێتەوە، جاری با (ئەدەبیاتی مەنگوڕی)تان بخەمە پێش چاو، سەرنجی بدەنێ بزانن چۆنە، بۆ ئەوانەی تریش خوا یاربێ هەرچیپەکمان لە دەس بێ دریغی ناکەین، ئەمجا تکاتان لێ ئەکەم گەلاوێژی ژمارە (٥) ساڵی (٥) بگرن بەدەستەوە و تەماشای لاپەڕە (٤٢)ی بکەن:

لە ڕباعی یەکەمدا مەنگوڕی ئەفەرموێ:

ئەگەر لەسەرتە مەیلی چاو ئەنداز
ئاگات لە خۆبێ لە ژنی زۆر جامباز
ئەوەی بەغەمزە و غەرام ئەتدوێنێ
لە چنگ هەزاران خۆی کردووە دەرباز

جاری لە پێش ئەوەی کە بۆ مەعنا بگەڕێین، چونکە (المعنی فی بطن الشاعر) دێینە سەر کێشانی، بۆمان دەرئەکەوێ کە مصرەعی دووەم و چوارەم لەنگن، ئەبوایە بی فەرموایە (ئاگات لە خۆ بێ لە ژنی جامباز) و وشەی (زۆر) لێرەدا زیادە و لە مصرەعی چوارەمدا بی فەرموایە (ئەگەر دروست بێ) لە چنگ هەزاران خۆی کردووە دەرباز.

لێرەشدا حەرفی (و) زیادە خۆ ئەگەر ماناشت ئەوێ نە من، نە تۆ خۆی تێناگا چی فەرمووە.

تەماشای ڕباعی دووەم بکەن ئەمەیە:

ئەوەی گەرەکیە خاکی کا پیرۆز
نابێ گوێی باتە ناڵەی جگەر سۆز
باغی ئیستقلال بەبێ خوێن نارِوێ
برات بێ خائن بیکە فدای هۆز

لەم ڕباعیەدا کەم و کوڕی تیا نییە لە کێشانا، بەڵام داخەکەم لەلایەن ماناوە نەیتوانیوە باش دەری بخا، ئەبوایە مصرەعی دووەمی ئەم ڕباعیە وابوایە (بەبێ گوێی دانە ناڵەی جگەر سۆز)وە لە مصرەعی چوارەمدا ئەگەر وابێ جوانتر نییە؟ (برات خائن بێ بیکە فدای هۆز).

ڕباعی سێیەم بەهەزار حاڵ و ناڵی عەلی پیاو ئەتوانێ مەعنایەکی بۆ بدۆزێتەوە و لەنگیش نییە بەڵام ئەگەر لە مصرەعی دووەما بیووتایە (ژیانت تأمین بکە ئەی دڵسۆز) گەلێ جوانتر بوو.

ڕباعی چوارەم ئەمەیە:

ئەوەی کە ئەتکا محبوب لەناو هۆز
ژیانی پاکە و ئاشنایی دڵسۆز
(دە) دۆستی یەک ڕەنگ لە خۆشی تاڵی
ئەتوانی تێکدا ئوردووگای ئاڵۆز

لە کێشا لەنگ نییە، بەڵام بەخوێندنەوەی مصرەعی ئەوەڵ شیعری شاعیرێکم دێتەوە بیر کە تازە فیکری کوردی بووبوو...

وتوویەتی (ئەمن لە تەفتیش هات لە کوردستان) ئیحتیاج ناکا ئەویتر بنووسین. خۆ مصرەعی چوارەمیش هیچ مەعنایەکی تیا نابینم، چونکە (اوردوگای ئاڵۆز) بە مەعنای ئۆردووگایەکە لەخۆیا پشێو و تێکچووبێ، ئیتر لە تێکدانیا چ هونەرێکی تێدایە؟

ئەمەش ڕباعی پێنجەم:

وەک مۆرەی شەترەنج ناگری ئاسایش
ئەو پیاوەی خۆی کرد بەدر و ئارایش



چونکە هەر وەزعێ کە تۆ لێ بدوێ
ئەبێ مەوزوعت بۆ بکا با جاریش

دەستم داوێنت کاکەی مەنگوڕی لەم ڕباعیەدا چ نیاز و مەبەستێکت هەیە، تووبی خوا ئەگەر بۆمان دەرنەخەی، جارێ لە یاری شەترەنجا مورە نییە و، مورەش ئاسایشی هەیە ئەبێ هەر بەلایەکا بکەوێ سایا لەسەر یەک، یا لەسەر دوو ئیتر بۆچی ئاسایش نییە؟ جگە لەوەش ئەگەر لێم ببوری ئەتوانم بڵێم ئەم ڕباعیە هیچ مەعنایەکی تیا نییە و کەس تێی ناگا.

وا ئەمجارە (ئەدەبیاتی مەنگوڕی)مان خستە پێش چاوی خوێندەواران مەبەستیشمان تەنها ئیسلاح و ڕێگا نیشاندانە هیچ ئامانجێکی ترمان نییە، هیوامان هەیە بتوانین لەم ئەرکەدا کە گرتوومانەتە ئەستۆی خۆمان کەم و زۆر خزمەتێکی شیعر و ئەدەبیاتی کوردی بەجێ بهێنین و هەروەکو لە پێشەوە وتوومانە گوێ نادەینە توانج و پلاری کەس، خەڵکی چی ئەڵێ با بیڵێ، دەس لە دەس و قوەت لە خوا.

گۆڤاری گەلاوێژ له كۆچی دوایی بێكەسدا

## كۆچی بێكەس

ئەرێ مەرگ! ئایا تاپۆیەكی خەیاڵیت و لەژێر سێبەری هەتاوا ئەژیت؟ یا تارمایی بەردێكی بێ گیانیت و له سووتانی دڵ لا ناكەیتەوە و نه باكت بەگەرما و سەرمای ڕۆژگار هەیە؟ هیچیان نیت بەڵكو وێنەیەكی بەسامیت، دڵت هەیە بەڵام ڕەقە، گوێت هەیە كەڕە، چاوت هەیە بۆ چاكانت هەڵخستووە، دەستیشت هەیە بڕیان ئەدەیت!!...

فایق شاعیر بوو كه لەم سەدەی بیستەمەدا پێوە بنازیت، خەیاڵاتی بەرزی بنەوبارگەی ئێمە بوو، دڵی ساف و پاكی ئاوێنەی بێ گەردی شاخەكانی كوردستان بوو كه تیایا ببرسكێنەوە، زمانی پاراوی ئێستگەی ئەو خەیاڵاتە خەملێوانە بوو كه ساڵەهای ساڵ له توێی دەروونی كۆرپە كوردەكاندایە، بەفیكری میللییەتیشی ئەوە دیارە وەكو مانگەكەی هاوڕازی له ئاسمانی كوردستاندا هاتوچۆی ئەكرد.

كەچی ئەو مەرگە دڵ ڕەقە نه بەزەیی بەبێكەسی ئێمەدا هاتەوە نه بەناكامی (بێكەس)دا، هیچ سەری لەو تۆفی ڕۆژی ١٩٤٨/١٢/١٨ نەكردەوە بەمێوانی، گیانی پاكی له باخچەی لەشیدا و گوڵی هیوای له باخی ژیانا هەڵكشا، لەشەكەشیان له شاری سلێمانی برد بۆ هەوارگەی ئازیزان، بۆ ناو دارئەرخەوانەكانی (گردی سەیوان)!

فایق تۆ كۆچت كرد بەڵام وا مەزانە كۆچی بێ خاوەن بووە، تۆ شاعیری بەرز بوویت، تۆ له ڕیزی نیشتمان دۆستەكانی دا بوویت، له بیرمان ناچێتەوە ناوەكەت وا له گۆشەی دڵمانا، فكرەكانت وا له پەڕەی مێشكمانا، ناوونیشانت ون ناكەین، جارێ بەدوعا تا ڕۆژی لیقا.



## هاوڕێم بێكەس!

شیعری گۆران

ئەی فریشتەی شیعری جوان!
كۆستی كەوتووی هەردووكمان!

بۆ ئەم جارە بێكەسە!
كە وتمان بێكەس، بەسە!

شاعیرێک بوو فەننان بوو،
ئەدای خوڕ، خرۆشان بوو،

بۆ باغچەی كزی كوردی
بولبول بوو نەغمەی وردی:

سەرەڕای بەهرەی فەننی
دڵسۆز بوو بۆ وەتەنی،

نركەی شیعری ڕزگاری
بێكەس، شتێكە دیاری:

له هەموو كوردستانا،
لەناو بیر ئازادانا!...

***

پەربی شیعری شۆخ و شەنگ!
تۆ دڵتەنگ و من دڵتەنگ.

با سكاڵا بۆ یەكتر
لەگەڵ ئاخی سارد و سڕ،

دوور و درێژ هەڵڕێژین!
مەیتی بێكەس ئەنێژین!

ئاشنای تۆ بوو، هاوڕێی من،
لێی داگیرکردین (مردن!)

ئەی پەری ناڕەوایە
فرمێسک لە چاومان نایە:

چونکە بێکەس بچووک بوو،
پایەی کۆمەڵیی سووک بوو!

کام پیاو ماقوڵ، کام گەورە
کە بەرزیی جێی ژوور هەورە،

وێنەی ئەو جوامێر بوو!
بەرامبەر دوژمن شێر بوو؟

لە کاتێکا ئەوانە
نۆکەر بوون بۆ بێگانە،

دەست لەسەر سنگ ئەوەستان،
یان بۆ پایە، یا بۆ نان...

بێکەس بوو وەک پاڵەوان
پەنجەی لە چاوی چەقان،

پەنجەی تیژی سەرزەنشت،
داخی دڵی خۆی پێ ڕشت!...

بەڵێ بێکەس نابووت بوو
جارجار برسی بوو، ڕووت بوو،

بەڵام کام تێر، کام پۆشتە
وێنەی ئەو، ئەی فریشتە



بێ باک وەستا بەرامبەر
نووکی سونگیی ستەمگەر؟

کێ وا: وا لەژێر زنجیرا
ئازادی هات بەبیرا!

بەشیعری جوان نەڕانی:
بەیادی کوردستانی!...

ئەی شۆخ و شەنگ، ئەی پەری،
زۆرتر بۆ ئەوەی بگری:

کە بێ بەرگی و بێ نانیی
خۆی لە ڕووی تۆ ئەزانی،

لەگەڵ ئەوەش تا مردن
نەکەوت لە تۆ پەرستن!

مل کەچی قیبلەی ڕووت بوو،
دێوانەی عیشوە و خووت بوو...

وەک هەندێ شاعیری تر
-تا ڕادەیەک گورچک پڕ-

تەماع هەڵی نەفریوان
شیعر بفرۆشێ بۆ نان؛

ئابڕووت بەرێ وەک بردیان،
بەو کردارانەی کردیان!...

***

لە پاشانا ئەی پەری!
نابێ لە بێکەس بگری،

کە گیرۆدەی مەستی بوو،
مەستیی ئەو مەبەستی بوو!

ناوچە و سەردەمی ژینی
پڕ بوو لە ناشرینی،

وڵاتی پەرێشان بوو،
بۆ هاووڵات زیندان بوو؛

نەتەوەی هەموو هەژار،
مایەی ڕەنجیان بۆ زۆردار،

هەموو برسی، دەغەزار،
نەزان و نەخوێندەوار...

دیل بوون: هەم بۆ بێگانە،
هەم بۆ ئەو زۆردارانە،

کە خۆیشیان ئەیانمژین
بۆ خەڵقیشیان سەر ئەبڕین!

ئەمجا کە ئەسیری ئاوا:
کەشتی بۆ گەردا و ئەڕوا،

هەزاران هاوار بکرێ
کەس نییە ڕێی ڕاست بگرێ

ناچار خۆی سەرخۆش ئەکرد،
هەستیی فەرامۆش ئەکرد!

جارجار، کە زۆر پەست ئەبوو،
کەمێکیش بەدمەست ئەبوو،



داخی دڵی خۆی ئەڕشت
بەجوێن، توانج، سەرزەنشت!

***

ئەی فریشتەی چاوخومار!
بەڵام بێکەسی هوشیار،

بێکەسی دنیای نووسین
دانەری بەستەی شیرین،

مەبەستی من و تۆیە،
بۆ ئەوە ئەم (ڕۆ - ڕۆ)یە!

تۆ: پەریی شیعر و جوانی
من: هاوڕێی گیانی گیانی

دانیشتین بەجووت، دڵ تەنگ،
بڕێژین فرمێسکی مەنگ،

بۆ شاعیرێک بێکەس بوو
بەڵام (کەس)، ئێمەی بەس بوو!

سا باڵای بۆ ڕەشپۆش کە،
گڕی شیوەنی خۆش کە،

بەپەردەی نزمی ماتەم
بەستەی کوردی پڕ لە خەم

لەسەر مەیتی بخوێنە
وەفای جوانی بنوێنە

بۆ شاعیرێک کە گیانی
لێی هەڵئەقوڵا جوانی،

ئەگەر چی هۆی بەختی خۆی
جوانیی فەساڵ نەبوو بۆی!

ناقۆڵا و تێکسمڕاو بوو،
ڕوومەت کونج، کزی چاو بوو

هونەر بۆ (ڕووخۆشی)ی بوو
کە خەوشی داپۆشیبوو!

بەڵام پەری!تۆ ژیری
خاوەندی هۆش و بیری؛

جوانیی باڵا و دەموچاو
بەهرەی تا سەرنێن بۆ پیاو؛

هەزار چاو جوان، قەد باریک
کەوتوونە چاڵی تاریک،

چی بەجێ ما لە دوایان،
بۆ دۆست و ئاشنایان؟

یا جوانێک تا (پیری) ما
کام گیرۆدەی بیری ما:

خوێنی کوڵمی چەن گەش بوو؟
چاو و بڕۆی ڕەش بوو؟

یەک جوانییە: بای پایز
گەڵای زەرد ناکا هەرگیز

کە، لە گیان، سەرچاوەی دڵ
سەر هەڵئەدا قوڵە قوڵ:



وەک ڕۆح سووکی، ڕووخۆشی،
خوێن گەرمی، خزمەت کۆشی

دڵی باش، دەروونی پاک
بیری ڕوون، کردەوەی چاک

پێشتری گشت ئەمانە:
بەهرەی هونەری جوانە!

بەڕاستی ئەو فەننان بوو،
سەلیقەی شیعری جوان بوو!

***

ئەی شێوە شۆخ، ئەی پەری!
دانیشە لای ژوور سەری،

وەک یاری وەفادار بە،
بەڕاستی خەفەت بار بە،

قژی زەرد با پەشێو بێ،
بەستەی خەم لەسەر لێو بێ:

تۆ بڵێ و منی هاوڕێ،
تا دەستم قەڵەم بگری

ئەنووسم: دێڕ دێڕ، بەن بەن،
بۆ بێکەسی شیعری شێوەن!...

زحمتە بێ من ژیانم

سلیمانی - ٢/١٠/٩٢٩

داخی فەرزانی عرفی خستمیە خاک و نیکەوە
گا بە دەست جرجیس و عبدو گا بە دەست اوفیکەوە
هەرکە روژ آوابو ایتر بو عرفە سکوت ئەکەم
وەک ولاخی بینە وەختی کاوو جوی آلیکەوە
چنگ لە سەرشان بوی ئە روینی خوم دلگرل چەند نگبەتی
بو ینا آشتی بە مزە و چاپی مل بارێکەوە
جا بە چوار مشقی لە سەر ارضی دائەنیشینی کوبەتی
بەزمی ایواران بە دەوری عارەقی مەستێکەوە
خوت سەرخوشی ئەگەر نوشی رفیقی توشی نەبی.
رابوێری هەر بە گورانی و قسەی عینیکەوە
عارق و یارە لە هەردوگەر سەرو رابعم هەبی
چیە ایتر من بە سەر الیانی و دوشمنو یچیکەوە
حەقە گەر عارفی بجوم توخوا رفیق لومەم مەکەن
زحمتە بێ من ژیانم بەم دلی تاریکەوە

ف. بێکەس



# پێڕست